سەنتەری ڕۆشنبیری کارا

هێنەری دەرد...... پەتای ناو خەڵکی

# هیوا درێژی

## طول الأمل

پوخت کردن و وەرگێڕانی

پشتیوان حسن کەرەم

ناوی نامیلکە : هیوا درێژی

ناوی ئامادەکار : دار ابن خزیمة

ناوی وەرگێڕ : پشتیوان حسن کەرەم

تیراژ : ۳۰۰۰

شوێنی چاپ : چاپخانەی زانا – سلێمانی ، شەقامی مەولەوی

==================================

## بنکەکانی بڵاوکردنەوە:

کتێبخانەی بەهەشت – سلێمانی – تەنیشت مزگەوتی بەهەشت .

کتێبخانەی الأثر – سلێمانی – نزیک مزگەوتی دارۆغا .

کتێبخانەی سیما – چەمچەماڵ – پشت بازاڕی دۆلارەکە .

سەنتەری کارزان چەمچەماڵ – پشت بازاڕی دۆلارەکە

کتێبخانەی کاروانی زانست – کفری .

کتێبخانەی کاروانی زانست – کەلار

کتێبخانەی صوهەیب – کۆیە .

کتێبخانەی پێشین – هەولێر .

تۆمارگای شافعی – هەولێر .

---

**سەرپەرشتی چاپ : کتێبخانە و تۆمارگای بەهەشت**

**کەلار – شەقامی سەرەکی – نزیک فلکەی ناوبازاڕ**

**۰۷۷۰۱۵۱۷۳۷۸**

هێنەری دەرد ..... پەتای ناو خەڵکی

# هیوا درێژی

## طول الأمل

پوخت کردن و وەرگێڕانی

پشتیوان حسن کرم

چاپی یەکەم

١٤٣٤ کۆچی

## بانگەوازێك لەدڵەوە.... پێش پەشیمانی

بانگەوازێك بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ خۆدا، ڕۆژگارەکان تێدەپەڕن وپەڕەکان دەپێچرێنەوەو ساڵەکانیش یەك لەدوای یەك دێن، هەموو یەکێك لەئێمە دەتوانێت لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات پێش ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت وکات لەساڵە تێپەڕبووەکانی تەمەنی ببردایە بۆ ئامۆژگاری وپەندو چاودێری خودا بەسەریەوە، ئەوە ڕۆژگارە ڕاددەکات وبەو شێوەیە دەڕوات بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەین مەگەر لەسەرەتای ساڵەوە نەبێت یان سەرەتای مانگ یان جەژن.

وە پرسیاری هەرە گرنگ ئەوەیە کە چیمان ئامادەکردووە بۆ گەشتی کۆتایی؟ چیمان پێش خستووە بۆخۆمان بۆ ئەوەی بیبینینەوە لای خوا بەباشترین پاداشت وباشترین ئومێد؟ ئەبێ چی لەپەڕەکانی ژیانمان تۆمار کرابێ؟ چ توێشوویەکمان ئامادەکردووە بۆ ئەو گۆڕەی کە دوانشینگەمانە....؟

ئایا لەبیری دوارۆژداین؟ ئایا شتێکمان لە قورئان خوێندووە؟ ئایا خوومان گرتووە بە خوێندنی ویرد و زیکرەکانی دوای نوێژەکان؟ وە یاخود لەنوێژدا خشوعمان هەیە؟ داوای بەهەشتمان کردووە؟ پەنامان گرتووە لەئاگر؟ ئایا داوای لێخۆشبوون دەکەین ڕۆژانە لەتاوانەکانمان؟

چونکە هەموو ڕۆژێك تاوان دەکەین بەڵام هەموو ڕۆژێك داوای لێخۆشبوون دەکەین؟

ئایا دوورکەوتوینەتەوە لەهەموو ئەوشتانەی کە خوا تووڕە دەکات؟ ئایا بیرمان کردۆتەوە لە وازهێنان ودوورگرتن لەهاوڕێی خراپ؟ ئایا دڵەکانمان پاك کردۆتەوە لە ڕق وکینەو حەسوودی وکیبر و زمانیشمان لەغەیبەت و فیتنەیی و درۆ؟ ئایا وازمان هێناوە لەسەیر کردنی نامەحرەم و ئەو شتەی خوا تووڕە دەکات؟ وە یاخود وازمان هێناوە لە گوێگرتن لەگۆرانی ومۆسیقاو ئەو شتەی خوا حەرامی کردووە؟ ئایا فەرمانمان بەچاکە کردووەو نەهیش لە خراپە؟ ئایا شتە بەنرخ وخۆشەویستەکانمان بەخشیوە لەپێناو سەرخستنی دینی خوا وبڵاوکردنەوەی؟ وە ئایا....ئایا....؟

بەڕێزان ئەمانە و چەندینی تر کۆمەڵە پرسیارێکی هەنووکەیین هەموومان دەگرێتەوە -تەنانەت تۆیش کە ئێستا دەیخوێنیتەوە-، ئەم پرسیارانە وەکو پرسیارەکانی تر نین چونکە بە بەڵێ و نەخێر وەڵام نادرێنەوە، بەڵکو وەڵامەکانیان بریتیە لە کردەوە، جا پێوستە لەسەر هەموومان ڕۆڵی پاك کردنەوەی دەروون وگوفتارو ڕەفتاری خۆمان و نزیکەکانمان و خەڵکی تر ببینین بەو شێوەیە کۆمەڵگە پاك وئاسوودە دەبێت گەر دەتەوێت.

# پێشەکی

بسم الله الرَّحمــن الرحِّيـم

الحمــد لله تعــالى المتــفرِّد بالكبريــاء. المنـــزَّه عــن النـــقائص والشُّركاء، والصَّلاةُ والَّــسلام علــى سيِّد الأصفيــاء، وقُــدوة الأولياء، وعلى آلِهِ وأصحابِهِ سادةِ الأتـقياء.

وبـعد:

برای موسڵمانم: دەبینی کە ساڵەکان تێپەڕدەبێ وتەمەنەکان دەڕوات! کەچی موسیبەت وبەڵای ئەم ڕۆژگارە دوایی نایەت!

برام: هەر ڕۆژێك کە دێت وتێپەڕدەبێت چەند وانـەو پەنـدو ئامۆژگاریـەکی گـەورەی لەگـەڵ خـۆی هـەڵگرتووەو ئامـادەی کـردووە، بـەڵام داخەکـەم کـێ لێـی وەربگرێـت وکـێ لێـی تێبگات؟!

وانەگەلێك کە هەموو ڕۆژێك دێـت ودەڕوات... و ڕۆژگـارێکی پەنـدئامێز بەناوچـەوانی زەمانـەوە تۆماردەکرێـت، هـەروەکو

بلێی به مرۆڤ دەڵێت: بیخوێنەوە گەر تۆ پەند وەردەگریت وتــێ دەگەیت!

برام: پێت ناڵێم، هەموو وانەو کارەساتێك بژمێرەو لەبەرکـە لە ژیاندا! بەڵکو پێت ئەڵێم: ئایا کە بەڵاو نەهامەتیەك هاتووە بەسەرتدا پەندو ئامۆژگاریت لێ وەرگرتووە؟

برام: ئای ئەم مرۆڤە چەند هەژارو نەفامــە، هــەموو ڕۆژێــك چاوی بەهیواو ئاواتەکانی هەڵدێت! وە بیری چۆتەوە کە هەرچی هەوڵ وتێکۆشان بکا تەنها ئەوەی بـۆ بەدەســت دێـت کـە بـۆی نووسراوەو دیاری کراوە!

خەون وخەیاڵی ئاڵتونی... ئاواتی نەبینراوی زۆر خـۆش.... ئومێدی ئارەزوو لەزەت، کەچی هیچ نیــە تــەنها قــەدەری خـوا نەبێت وبەویستی ئەو دانەبەزێـت!

خۆشەویستم لەبەر خوا: چەند ئومێدو هیوات هەیە کـە لـە دونیادا پەتی فیکرو خەیاڵ وبیرکردنەوەی خۆتت پێوە گرێداوە؟ وتەمەنی خۆتت لە پێناودا بەسەربردووە؟

برام: ئایا دەزانی ئەو نەخۆشیە کوشندەیە چیە؟ کە داناکـان لـە چارەسـەرکردنیدا دەستەوسـان مـاون و زاناکـان لـە وەسـف وباسکردنی شیفاو لابردنیدا زۆریان وتووە؟

برام ئەوە نەخۆشـی ( هیـوا درێژیـە) وا ئێـستا بـۆتی بـاس دەکەم:

پێشەوا قورتوبی دەڵێت: هیوا درێژی بریتیـە لـە سـووربوون لەسـەر دونیـاو پـاڵ پێـوە دانـی وپـشت پـێ بەسـتنی وخـۆش ویستنی و پشتگوێ خستنی دوارِۆژ وبیرلێ نەکردنەوەی.

پێـــشەوا ابـــن حجـــر دەڵێـــت: بریتیـــە لـــە زێـــدەخوازی و ئاواتەخوازی ئەوەی نەفس پێی خۆشەو حەزی لێیەتی لە تەمەن درێژی و ساماندارێتی.

پێشەوا قورتـوبی دیـسان دەڵێـت: هیـوا درێـژی بریتیـە لـە دەردێکی کوشندەو نەخۆشیەکی درێژخایەن! وە هـەرکاتێك لـە دڵدا جێی خۆی کردەوەو جێگیربوو ئـەوا خـووی تێـك دەدات و چارەسەری سەخت وگران دەکاو وای لێ دەکا هەرگیز نەخۆشـی

لێی جیانەبێتەوەو چارەسەریش سوودی پێ نەگەیەنێت، بـەڵکو پزیشەکەکان دەستەپاچە دەکاو داناکان لەچارەســەرکردنیدا بـێ ئومێدبوون.

خوێنەری خۆشەویـست: خـوای گـەورە سەرزەنـشتی نـەیارو دوژمنەکانی کردووە بەوەی کـە هیـوا درێـژن لـەدونیاداو هـەر ئەوەش وای لێکردوون کـە پـشت بکـەن لـە ڕێنمـایی وڕێگـای ڕاست.

خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی دەفەرمووێت ﴿ذَرْهُـــمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا وَيُلْهِهِمُ الأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ (٣) ﴾{الحجـر}

واتە: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وازیان لێ بێنـە بـا وەکـەروەك ئـاژەڵ بـۆ ماوەیـەکی کـەم بخـۆن وڕابـوێرن! وهیـواو ئاواتەکانیـشیان سـەرگەرم وسـەرقاڵیان بکـات وبیانخـافڵێنێ لەتۆبەنەکەن ئەوجا بۆ دوایی دەزانن چییان پێ دەکەین.

وە خوای گەورە لە سەرزەنشتکردنی جولەکەکاندا دەفـەرمووێت ﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ وَمِنْ الَّذِينَ أَشْرَكُوا يَوَدُّ

أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنْ الْعَــذَابِ أَنْ يُعَمَّرَ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ (٩٦) ﴾{البقـرة}واتـه: سـوێندبێ بەخوا، دەبینی جولەکە لەهەڵپە بۆ ژیانی ئەم دونیایە لەتەواوی مەردم، بگرە لەو کەسانەش شەریك بۆ خوا دادەنێن، سـوورترو تامــەزرۆترن! هــەرکام لەوانــە ئاواتــەخوازەو پێــی خۆشــە کــە هەزارســاڵ تەمــەنی هــەبێ وبــژی! خــۆ ئەگــەر ئــەو تەمــەن درێژەیشی بدرێتێ – کاتێ مردوو گەڕایەوە بۆ لای خــوا- بــەو تەمەنــە درێــژەی لەســزای خــوا دوور ناخرێتــەوە ورزگارنــابێ، خواش بەو کاروکردەوەی کە ئەوان دەیکەن زۆر بینایە.

بــرای موســڵمان ویەکخواپەرســتم: ئایــا لەگەڵمــدا تووشــی سەرسوڕمان نایەیت کــە ئــەو جــۆرە مرۆڤانــە بــەردەوام هیــواو ئاواتیــان بــەرزیان دەکاتــەوەو نزمیــان دەکاتــەوە، تــا هــەموو تەمەنیان دەخواو دەڕوخـێنێ ورۆژگارەکـانی گـەنجی ولاوێتیـان دەبا کەچی ئاواتەکەیان بەسەوزی وتەڕی هەر ماوەتەوە!

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت " لا يـزال قلب الكبير شاباً في اثنتـين: في حب الدنيا، وطول الأمـل" {رواه البخاري ومسلم} واتە: بەردەوام دڵی کەسی بەتەمەن وبەساڵاچوو گەنج ولاوە بەخۆشەویستی دوو شتەوە: بۆ خۆشەویستی دونیاو هیوا درێژی!

وە هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت " يكبر ابن آدم ويكـبر معـه اثنـان: حـب المـال، وطـول العمـر " {رواه البخـاري ومسلم}واتـە: ئـادەمیزاد گـەورە دەبـێ و دووشـتیش لەگەڵیـدا گەورە دەبن، کە ئەوانیش: خۆشویستنی ماڵ وسامان و تەمەن درێژیە!

**برام: ئایا نازانی کە هیوا درێژی هۆکارێك بووە بۆ بەهیلاك بردن ولەناوبردنی زۆرێك لە ئوممەت وگەلەکان؟**

وە ئایا دەزانی کە ئاواتی کورت ودونیانەویستی هۆکاۆێکی سەرەکی بووە چاککردنی جیلی یەکـەمی ئـەم ئوممەتـە(ڕەزای

خوایان لیّ بیّت)؟ وا هەندیّك لەنموونەو بەڵگەت بۆ ئەهیّنمـەوە بۆ دڵنیاییت کە هیچ گومانیّکی تیّدانیە:

پیّغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفـەرمویّت " صـلاح أول هذه الأمة بالـزُّهـدِ واليقـين! ويهلك آخرها بالبخل والأمـل" {رواه أحمد في الزهد في الأوسط/ صحيح الجامع: ٣٨٤٥}.

واتە: چاکبوونی سەرەتای ئەم ئومەتە بە دونیانەویستی ویەقینە و خراپبوون وتیاچوونی کۆتاییەکەیشی بە ڕژدی ورەزیلی وهیوا درێژیە!

هەندیّك لە داناوپیاوچاکان وتوویانە " ئاگادرای هیوا درێژی بن چونکە هۆکاری تیاچوونی ئومەتەکانە"

لـە ڕاسـتیدا هیـوا درێـژی پەتیّکـە لەپـەت وگوریسـەکانی ئیبلیسی نەفرەت لیّکراو کە فڕیّی دەداتە سـەر ڕیّگـای نـەوەی ئادەم ودەیگریّت ودەیکات بە کۆیلەو بەویستی خۆی فـەرمانی پیّ دەکات ( وەکو تینوویەك کە هەرگیز تینویّتی نەشکیّت).

وە هـەروەها وتوویانـە" هیـوا درێـژی دەسـەڵاتی شـەیتانە بەسەر دڵە بیّ ئاگاکانەوە".

فــضيلی كــوڕی عيــاض دەڵێــت " هيــوا درێــژی لــە بەدبەختيەوەيەو ئاوات كورتيش لە خۆشبەختيەوەيە".

محمدی كوڕی واسع دەڵێت" چـوار شـت لـە بەدبەختيەوەيـە: هيوا درێژی، دڵ ڕەقی، ووشك بوونی چاو(نەگريان)، ڕەزيلی".

ئەی ئەو كەسەی كە ئێستا ئەم دێڕانە دەخوێنيتـەوە: چـەند ئومێدو هيوا لە ناخماندا هەيە وگەشەی پێ دەدەيـن؟ وە هـەتا بێت زۆرتر دەبن و گەورە دەبن؟ ئايا تا ئێـستا لێپرسـينەوەمان لەگەڵ كردوون وپرسيارمان لێكردوون؟ ئەی نەفس چيت دەوێت لەم هيواو ئاواتە درێژانە؟

ئايــا مەبەســتت بــەو ئاواتانــە خــواو ڕۆژی دواييــە؟ يــان مەبەستت لێيان دونياويستی ودڵخۆشكردنە بەم ڕۆژگارە كـاتی ودوابڕاوە؟

ئايا فێری نەفسی خۆمان كردووە كە مەرگ كتوپڕەو لەناكاو دێت؟ پێش ئەوەی ئاواتــەكانت بــەدی بـێن دەڕۆيـت وبـەجێيان دێليت؟ ئای نەفس چەندە بێ ئاگای؟!

لــه عبــدالله ی كــوڕی مــسعود ه‌وه(ڕه‌زای خــوای لێ بێــت) ده‌ڵێــت: پێغه‌مبــه‌ری خـوا (صــلى الله علیــه وســلم) هێڵێكـی چوارگۆشه‌ی كێشا، وه هێڵێكی تری له‌ناو چوارگۆشه‌كه‌دا كێشا به‌ره‌و ده‌ره‌وه‌، وه چه‌ند هێڵێكی كورت وبـچووكی لـه لای ئـه‌و هێڵـه‌وه كێـشا كه‌لـه ناوه‌ڕاسـتدایه لـه‌لای ناوه‌ندیـه‌وه‌و پاشـان فه‌رمووی: ( هذا الأنسان وهذا أجله محيط به –أو قد احاط به- وهذا الذي هو خارج أمله، وهذِهِ الخُطَط الصِّغار الأعـراض فـإن اخطأهُ هذا نهشهُ هذا وإن أخطأهُ هذا نهشهُ هذا ) {رواه البخاري}

واته: ئه‌مــه مرۆڤــه‌و ئــه‌وه‌ش ئه‌جه‌لیــه‌تی كــه ده‌وری داوه‌، وه ئــه‌وه‌ش كــه بــۆ ده‌ره‌وه‌یـــه هیواوئاواتـــه‌كانێتی، وه هێڵـــه كورتــه‌كانیش ڕێگره‌كـانن جـا ئه‌گـه‌ر ئه‌مــه‌یان نـه‌یگرت ئــه‌وا ئه‌وه‌یان شكستی پێ ده‌هێنێـت وبه‌وشێوه‌یه.

عه‌ونی كوڕی عبدالله ده‌ڵێت: چه‌ند داهاتوو ئاینـده هه‌یـه كـه پێی ناگه‌یت وچاوه‌ڕوانی سبه‌ینێ ده‌كه‌ی كه بۆت ته‌واو نـاكرێ

ودەڕوا! ئەگەر ئێوە سەیری مەرگ وناخۆشیەکانی بکەن ئەوا ڕقتان لە هیواو ئاواتی دورو درێژ دەبێتەوە.

ئای چەند پشتمان بەستووە بە خەیاڵە دوورەکان وپەتی بیروئەندێشەمانی پێوە گرێ داودو هەمیشە چاوەڕوانی بەدی هاتنی دەکەین، کەچی لەپڕ خۆمانیش دەڕۆین و تەنها کات کوشتن نەبێت هیچی بۆمان نەمایەوە، برام: باپێکەوە کەمێك بوەستین وهەڵوەستەیەك بکەین، ئایا خاوەن هیوا درێژەکان کەسیان گەیشتوون بە خەیاڵی خۆیان؟ خەونی بێ وێنەی خۆیان بۆ بەدی هاتووە؟ ئەو خەون وخەیاڵەی کە زۆربەی کاتی ژیانی خۆیانیان بۆ تەرخان کردبوو.

بەرێزەکەم: ئایا ئەگەر خاودن خەیاڵەبڵاوەکان گەیشتن بە ئاواتی خۆیان ومەبەستی خۆیانیان بۆ دەستگیربوو، ئایا ئیتر مێشکیان بەتاڵ دەبێت لە خەیاڵ و قەناعەت دەهێنن؟ یان بیر لە هیواوئاواتێکی تر دەکەنەوە؟ دڵنیام وەڵامەکەی دەزانی.

يا ذا المُـومِّلِ آمالاً وإن بَعُـدَتْ

منهُ ويَـزعُـمُ أن يُحـظَى بأقْصاها

أنَّى تَفُوزُ بما تَرجُوهُ وَيكَ ومَا

أصبَحتَ فِي ثقةٍ من نيلِ أدناهـا

شاعیریش دەڵێت:

عومرت دووسەدبێ سێ سەدبێ، هەزار

لە ئەم دونیـایە دەرئـەچی نـاچـــار

هەردوو یەك نرخـە، هەروەکـو یـەکـە

پاشای شـاران بـی یـا گـــەدای بـازارِ

با موڵکـی تـۆبـێ مـیسرو ڕۆم وچیـن

لە ژێـر پێتا بـێ سـارای سـەرزەمـین

بەشـی مـن وتـۆ هـەروەکـو یـــەکـە

دە گـەز کفنەو یەك دوو گـەز زەمیـــن!

برام: ئەوە نەفسی خۆتە وخۆتیش شارەزاترین کەسی پێی، لێی بپرسە وگومانی ئەوەشت پێی هەبێت کە ڕاستت لەگەڵ

ناكات، بەڵام برام ئەگەر بەڕاستی ئەگەر لێپێچینەوە لەگەڵیدا بكەی ئەوا نەخۆشیەكەی دەتوانی دەست نیشان بكەی، وە ئەگەریش نەخۆشیەكەت زانی ئەوا چارەسەر ئاسانە...

برام: ئایا نابینی وهەستت پێ نەكردووە كە دڵ چەندە ڕەقی وتوندی باڵی بەسەردا كێشاوە؟ نە هەڕەشە دەیترسێنێ، نە پەیمانی خۆشیش چاكی دەكاو نەرمی دەكا، تەمەڵە گەر بانگ بكرێ بۆ عیبادەت وخواپەرستی، كەچی گورج وسووكە گەر بانگ بكرێ بۆ ئارەزووبازی!

برام: ئەوە نەخۆشی هیوا درێژیە! سەرۆك وگەورەی نەخۆشیەكانەو بانگكارو بانگخوازی ئارەزوو ڕابواردنە!

برام: خراپترین وترسناكترین نەخۆشی بریتیە لە هیوا درێژی، وە ئەوەش كە لەهیوا درێژیەوە لەدایك دەبێت وبەرهەم دێت بریتین لە: تەمەڵی لە خواپەرستیدا، دواخستنی تۆبەو پەشیمانی، ویست وڕەغبەت بۆ دونیا، بیرچوونەوەی دواڕۆژ، دڵ ڕەقی، چونكە نەرمی وچاكی دڵ پەیدادەبێت بەهۆی: یادكردنی

مردن، بیرکردنەوە لە گۆڕ، وپاداشتی دوارۆژو سزاو تۆڵەو ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمْ الأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ واتە: زۆریان بەسەردا تێپەڕی ئەوسا دڵیان ڕەق بوو.

بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە کە هەموومان دڵنیاین کە مردن هەیە کەچی ئامادەسازی بۆ ناکەین وناترسین! وە دڵنیاین کە بەهەشت هەیەو کەچی کردەوەی بۆ ناکەین و سوورنین لەسەری! وە ئەزانین کە ئاگری دۆزەخیش هەیە کەچی لێی ڕاناکەین و ترسمان نیە! برام ئایا سەیر نیە کە تەمەنەکان دەڕواو هیواکان دوایی نایەن؟ هەموو ڕۆژێك ئاواتێکی هەیە، هەموو مانگێك هەموو ساڵێك ئاواتی خۆی هەیە! ئا بەو شێوەیە خاوەن هیواکان لە گەشتێکی بێ کۆتایی هیوا و ئاواتدا دەژین!!

هەندێك لە داناو پیاوچاکان ووتویانە: چۆن دڵخۆش دەبێت بە دونیا کەسێك کە ڕۆژەکانی مانگی دەخوات و مانگەکانی

ساڵ دەخوات و ساڵەکانی تەمەنی دەخوات و تەمەنەکەیشی سەری بەرەو مردن دەکێشیٚ؟

ومـا هذهِ الأيـام إلا مـراحــل
يحثُّ بها داعٍ إلى الموتِ قاصدُ
وأعجبُ شيء لو تأمَّلتَ أنَّـها
منازلُ تُطـوى والمسافرُ قـاعِـدُ

برام تۆ لەکوێی کاتە بەتاڵەکانتی؟ ئایا لە خواپەرستیدا بەسەری دەبەیت؟ یان بەدوای تراویلکەی(سەراب)ی خەیاڵ وئەندێشەی لەبن نەهاتوودا دەیگوزەرێنی؟

موعاویەی کوڕی قَرّة دەڵێت: توندترین وسەختترین لێپرسینەوە لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ کەسێکی ساغ وکات بەتاڵدایە.

خۆشەویستم لەبەر خوا: کەسی بڕوادار تەنها شتی جیددی وپەیوەست بە دوارۆژەوە سەرقاڵی دەکات. کەسی بڕواداری

ڕاست هەمیشە لە تێکۆشان و بەربەرەکانێدایە لەگەڵ نەفسی خۆیدا.

خلیدی العصری دەڵێت: بڕوادار نابیبنی تەنها لە سێ شوێن وکاتدا نەبێت: لەمزگەوتێك کە خەریکی خواپەرستیە، یان لەماڵ کە دایدەپۆشێ، یان پێویستیەکی دونیای.

برام: ئایا دەزانی دونیانەویستی ڕاستەقینە کێیە؟

ئا ئەوە پێشەواو زانای ئەهلی سوننەیە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پرسیاری لێ دەکەن چ شتێك زوهدە لە دونیادا؟ ئەویش دەڵێـت: هیوا کورتی! ئەوەی ڕۆژی لێ دەبێتەوە چاوەڕێی ئێوارە نەکات!

بەڕێزم: دڵی بڕوادار زۆر لەوە گرنگترە وبەنرخترە کە پەیوەستی بکەیت بە دونیاو پڕی بکەیت بەخەیاڵ وئومێدی دونیای بێ نرخ، بۆ ئەوەی تەمەنت لە دەست بچێ و وەئەگەر شتێکت چنگ نەکەوت تێیدا خەم وپەژارە دات بگرێت و بێ ئارام بیت.

پێشەوا ابن قیم دەڵێت: دونیا لە سەرەتایەوە تا کۆتاییەکەی یەکسان نیە بە غەم وخەفەتی ساتێك چ جای غەمی هەموو تەمەن!

چەند کەس هەبوون کە دونیایان کۆکردبووەوەو دابویان بەکۆڵدا وپێی دڵخۆش وبەختەوەربوون؟ بەڵام مردن لەناکاو هات وهیچ شوێنی نەکەوت تەنها کردەوەکەی نەبێت.

لەگەڵمدا گوێ بگرە بۆ ئەم وەسیەتە بەنرخەی هاوەڵی بەرێز ابو الدرداء (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕۆژێك لە مزگەوتی دمشق وەستاو دەیوت: ئەی خەڵکی دمشق ئایا گوێ ناگرن بۆ کەسێکی دڵسۆز بۆتان؟ ئەوانەی پێش ئێوە زۆر سامانیان کۆ دەکردەوە، وبینای توندوتۆڵ وبتەویان دروست دەکرد، وهیوا و ئاواتی دوور و درێژیان هەبوو، بەڵام کۆکردنەوەکەیان بوو بەزیان بۆیان و بیناکەشیان بوو بە گۆڕ بۆیان و هیواو ئاواتەکانیشیان هیچ دەرچوو سەری نەگرت! ئەوە گەلی عاد بوون کە وڵاتیان پڕ کرد بوو لە کەس وکاری خۆیان و ماڵ

وسامان! جا ئەمڕۆ كێ پاشماوەكەیانم لێ دەكڕێ بە دوو دەرهەم؟!

خوێنەری چاكەخواز: ئایا پێم نالێیت كێ پێی ووتی كـە دونیـا شوێنی مانەوەی یەكجاریە؟ ئایـا نـابینی كـە خـەڵكی هـەموو ڕۆژێك كۆچ دەكەن بۆ دونیای ڕاستەقینەی نەبڕاوە؟ ئەوە كێیـە كە زۆر تەمــەنی كـردووە لـەم دونیایـەداو هـەموو ئاواتـەكانی بەدی هاتووە؟ ئایا وەسیەتەكەی پێغەمبەرت نەبیستووە (صلی الله علیه وسلم) كە شانی ابن عومەری گرت وپێـی فـەرموو " كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ " واتــە: لـەدونیادا وەكو كەسێكی نامۆ یان ڕێبوار بژی. رواه البخاري (٦٤١٦) .

وە ابن عمریش دەڵێت: گەر ئێوارەت بەسەردا هات چاوەڕێی بەیانی مەكە وە گەر ڕۆژت لێ بوویەوە چاوەڕێی ئێوارە مەكە!

پێشەوا ابن رجب دەڵێت: لەكاتێكدا كە دونیا بۆ مرۆڤی بڕوادار شــوێنی مانــەوەی هەمیــشەیی نیــەو نیــشتمانی جــێگیروو دامــەزراویش نیــە دەبێــت حــاڵی تێیــدا لــەم دوو حاڵەتــەدا

دەرنەچـێت: یـان ئەوەیـە وەكـو كەسـێكی نـامۆ(غریـب) كـە دانیشتووی وڵاتێكە لەدوور نیشتمانی خۆی هەموو خەم وبیری كۆكردنەوەی توێشووە بۆ گەڕانەوە بۆ وڵاتـی خـۆی، وە یـاخود وەكـو ڕێبـوارێكی بەڕێـدا تێپـەڕبوو كـە هـەموو شـەوو ڕۆژی بەڕێوەیە بەرەو وڵاتی نیشتەجێی خـۆی، هـەر بۆیـە پێغەمبـەر وەسیەتی كردووە بۆ ابن عمر بەو شێوەیە بێت!

**نصری كوڕی محمدی سەمەرقەندی دەڵێت: ئەوەی هیواو ئاواتی كورت بێت خوای گەورە چوار بەخششی پێ دەبەخشێت وڕێزداری دەكات بە چوار خەڵات:**

**یەكەم:** بەهێزو توانـای دەكـات لەسـەر خواپەرستی، چـونكە بەندە كە دەزانێت زوو بـەم نزیكیـە دەمرێـت گـوێ نـادات بـە كاری ئایندەی دووری و هەمیشە كۆشش دەكات بـۆ پەرستش وزۆر كردنی.

**دووەم**: غەم وپەژارەی کەم دەبێتەوە چونکە دەزانێت بە زووانە دونیا جێ دەهێڵێت.

**سێیەم**: وای لێ دێت بەکەم ڕازی دەبێت چونکە مادام دەزانێت بەم نزیکیە دەمرێت هەموو ئاواتی دوارۆژە.

**چوارەم**: دڵی پڕ نوور دەکات.

**وە ئەوەشی هیوا وئاواتی درێژ بێت ئەوا خوا سزای دەدات بە چوار شت:**

**یەکەم**: تەمەڵی لە عیبادەت.

**دووەم**: غەم وپەژارەی زۆر دەبێت لە دونیادا.

**سێیەم**: سووردەبێت لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ وسامان.

**چوارەم**: دڵ ڕەقی دێتەبەرهەم.

خوشــك وبــرای موســڵمانم: بــا وەك ئــەو پیاوچــاك وبــۆ خواصوڵحاوانە بین کە هەمیشە سەرقاڵی ناخی خۆیان بوون ولە پێناو ڕەزامەندی خوادا، شەو ورۆژیان بەڕێ دەکرد:

زانایان دەڵێن: "العاقل یعتمد علی عملِه، والغافلُ یعتمد علی أملِه" واتە: مرۆڤی ژیر پشت دەبەستێت بەکردەوەکەی، بەڵام کەسی بێ ئاگا پشت دەبەستێ بە هیواو ئاواتی!

ئووەیسی قەرەنی(رەحمەتی خوای لێبێت) پێیان ووت: دونیاو زەمان بەلاتەوە چۆنە؟ ئەویش ووتی: زەمان بەلای کەسێکەوە چۆن بێت گەر ئێوارەی بەسەردا هات وا گومان دەبات کە رۆژی لێ نابێتەوە! وە گەر بەیانی لێ بوویەوە چاوەڕێی ئێوارە ناکات! نازانێت مژدەی ئاگری پێ دەدەن یاخود بەهەشت؟

هەندێ لە پێشینان ووتویانە: هەرگیز بەشێوەیەك نەخەوتووم کە چاوەڕێی هەستانی لێ بکەم(وام دەزانی دەمرم)!

جارێکیان محمدی کوڕی ئوبەی لەگەڵ مەعروفی کەرخی پێکەوە دەبن، کاتی نوێژ دێتە پێشەوەو بە محمد دەڵێت فەرموو بڕۆ پێشەوە نوێژمان بۆ بکە، محمدیش دەڵێت: ئەگەر ئەم نوێژەتان بۆ بکەم ئەوا نوێژی ترتان بۆ ناکەم(بە ئیمامەت)، مەعروفیش دەڵێت: ئایا تۆ خۆت واداناوە هەتا نوێژێکی تر بە زیندوو

بمێنت؟! پەنا بەخوا لە هیوا درێژی چونکە ڕێگرە لـە کـردەوەی چاك.

براو خوشکی داوێن پاکم: نەفسی خۆت ڕابهێنە بـە بیرکردنـەوە بەشـتی گـەورەو مـەزنـەوە، پەیوەسـتی بکـە بەئاسمانـەوە، بـە قورئانەوە، تا وای لیٚ دێت ملکەچت دەبـیٚ و کـەمترین زیانـت پیٚ دەگەیـەنێت، زۆر نەفـست بـشکێنە وگوێڕایـەڵی مەبـە، وە هەرکە تاوانێکیشت کرد زوو پەشیمان بـەرەوەو نەفـست لۆمـە بکـەو سەرزەنـشتی بکـە، بـۆ ئـەوەی ببـی بەیـەکێك لــە بەشـداربووانی ئـەم ئایەتـە: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّــةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِــي عِبَــادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي (٣٠)﴾ {الفجر}.

واتە: لەسەرەمەرگدا بەنەفسی ئیماندار دەوترێـت: ئـەی گیـان ورۆحی ئارام بەیادوزیکری خوا، بگەڕێوە بۆلای پـەروەردگارت، ئـاوا کـە ڕازی کردبوویـت بەپاداشـتی خـۆی ولیـێت ڕازی بـووە بەهۆی ئەوەی پێشی خۆتت خستووە لەکردەوەی چاك، دەبچۆرە

ناو گیانی بەندە صاڵحەکانمەوەو بچۆرە بەهەشتە ڕازاوەکەمەوە کە ئامادەم کردووە بۆت.

هیواو ئاواتیش دووجۆرە: یەکێکیان کورتەو سەرقاڵت ناکات لە پەرستن ورۆژی دوایی، ئەم جۆرەیان تاوانی تێدانیە، بـەڵام ئـەو جۆرەکەی تریان درێژەو دوورت دەخاتەوە لەپەرستن ودەکەوێتـە نێوان تۆو بیرکردنـەوەو ئامادەسـازی بـۆ ڕۆژی دوایـی ومـردن، ئەمەیان ڕێگە پێ نەدراوەو خراپە.

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين، وصَلَى اللهُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّد، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّم.

# سەنتەری ڕۆشنبیری کارا

سەنتەرێکی ڕۆشنبیری و بانگەوازی ئیسلامی و گشتی هەمە لایەنە ، نا حزبی و سەربەخۆیە ، هەوڵەکانی دەخاتە گەڕ بۆ سەرخستنی بەها باڵاکان.

بۆ تێگەیاندنی ڕۆڵەکانی کوردستان و کورد زمان بە بیروباوەڕی ئیسلامی ڕەسەن بە پێی بەڵگە و تێگەیشتنی باشترین پێشینەکانی ئوممەتی ئیسلام.

دروست کردنی تاکی دڵسۆز و کارا بۆ خزمەتی ئیسلام و نیشتمان بۆ ئەوەی هۆکاری پێشکەوتنی وڵات و خەڵکی بن..

بەرنامەی پەرستن و کار و بانگەواز ، بۆ ئەوەی خەڵکی دڵسۆز بە بەرچاوڕوونی تێبکۆشن و هەنگاو هەڵنێن.

ڕێکردنەوەی تەوەری گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن بێ کورت هەڵهاتن و توندبورن ، تەنها بەڵگە و تاوتوێ کردنی بۆچوونەکان و یەکلابوونەوەی وتەکان و بۆچوونەکان لە ڕوانگەی بەڵگەو بنچینەکانی ئیسلام .

هەنگاونان بەرە و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی پەیوەست بە ئاینەکەیەوە ، فراوان لە کردار و گەورە لە بیرکردنەوە و جوان لە ڕەفتاردا.

ئامانجی هەموو کارەکانیشمان تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەیە، وە پاشان خزمەت کردنی کۆمەڵگاکەمانە..

لە دوعای خێرتان بێ بەشمان مەکەن

canterkara@gmail.com

# پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لەوەی:

خوای گەورە دەتبینێت، وە لە ئاشکرا و نهێنیش بە ئاگایە و دەیزانێت.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لەوەی:

فریشتەکان هەموو وتە و کردەوەکانت دەنوسن و هیچیان لە بیر ناچێت.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

سزا و تاریکی ناو گۆڕ ئەو گۆڕەی کە بۆ چاکەکار دەبێتە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت، بۆ خراپەکاریش دەبێتە چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ ئەو کات نە باوکێکی دڵسۆز نە دایکێکی بەسۆز کەست لا نیە.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

ئەو کاتەی کە هەر کەس نامەی کردەوەی خۆی پێ دەدرێت چاکەکار بە دەستی ڕاست و خراپەکاریش بە دەستی چەپ.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

ئەو ڕۆژەی کە ئەندامەکانی لاشەت دەبنە شایەت بە سەرتەوە لە سەر ئەو چاکە و خراپانەی کە کردووتە.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

ئەو ڕۆژەی کە خراپەکاران هاوار و واوەیلایانە لە دەست نامەی کردەوەکانیان کە ورد و درشتی تێدا نوسراوە و هیچ تاوانێکی تێدا لە بیرنەکراوە.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

ئەو ڕۆژەی کە بەسەر پردی (صراط) دا تێپەڕ دەبیت و قولاپەکانی دۆزەخ شاڵاوت بۆ دەهێنن.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

ئەو ڕۆژەی کە لەبەر دەستی خوای گەورەدا ڕادەوەستیت و ئەو تاوانانەت بیردەخاتەوە کە لە ژیانی دونیادا ئەنجامت داوە.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

ئەو ڕۆژەی کە تاوانبار دەڵێ:(ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادان و نادروستیانەی کە کردم).

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لە:

ناڕەحەتی و گەرمی و سزای دۆزەخ.

* پێش ئەوەی تاوان بکەیت بیربکەرەوە لەوەی:

کە تاوان دەبێتە هۆی بێبەشبوون لە زانست و ڕزق و دەبێتە هۆی سنگ تونلی و تەمەن کورتی و مردنی لەناکاو و نەمانی شەرم و غیرەت.

وە لە گەورەترین سزاکانی تاوان پەیوەندی نێوان بەندە و پەروەردگاری دەبڕێت ئەگەر ئەم پەیوەندیەش پچڕا ئەوا لە خێر و چاکە دوور دەبێت و شەڕو خراپەی تووش دەبێت.

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين

پێشەوا قورتوبی دەڵێت : هیوا درێژی بریتیە لە سووربوون لەسەر دونیا ، و پاڵ پێوە دانی ، و پشت پێ بەستنی ، وخۆش ویستنی ، و پشتگوێ خستنی دوارۆژ ، وبیرلێ نەکردنەوەی.

پێشەوا ابن حجر دەڵێت: هیوا درێژی بریتیە لە زێدەخوازی ، و ئاواتەخوازی ، ئەوەی نەفس پێی خۆشە ، و حەزی لێیەتی لە تەمەن درێژی ، و سامانداریێتی.



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی ( ١٨٢٥ )ی ساڵی (٢٠١٢ )ی پێ دراوە.
دیزاین ماڵپەری بەهەشت
www.ba8.org